# ئاوێنەی خواناسین

## ئایا خوا هەیە؟




صابر كرد عازەبانی

# ئاوێنەی خوا ناسین
# ئایا خوا هەیە ؟

ئەم پەرتووکە بریتییە لەچەند بەڵگەیەکی فەلسەفی زیرایەتی
لەسەر بوونی پەروەردگارێك بۆدروستکردنی ئەم بوونەوەرە

بەشی یەکەم

١٤٠١ك - ١٩٨١ ز

چاپی دووەم

دانەر
صابر حمد علی عبدالله کردحازەبانی

بەرەزامەندی وەزارەتی راگەیاندن لەچاپ دراوە

( وێنەی دانەر )



(إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ)

( صدق الله العظيم )

[ بەناوی خواوەندی بەخشندەو میهرەبان
دانەرو خاوەنی زەوی و ئاسمان ]

# پێشەکی

خوێنەرانی بەرێز بەراستی ماوەیەکی زۆر لەمێژبوو ، بیرم لەمە دەکردەوە کەیەکێك لەزاناکانی ئایینی ئیسلامی پیرۆز هەڵسێ بەدانانی پەرتووکێك لەبارەی بوونی خـوا ، کەوا بە بەڵگەی سەلمێنەری ژیرایەتی ، قەناعەت بەوتاییە سەرلێشێواو سەرگەردانو گومراو مل هورانە بهێنێ ، کەدووی بیری فەلسەفەی پرو پووچو بێماناو بێ ئامانجی ، ئەم چاخە کەوتوونەو بزیان روون بکاتەوە کەوا خوایەك هەیە لە سەرەتاوە ، ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە ، تا پێی بێنەوە سەر رێرەوی خوا ناسەتی و متمانە دارێتی ، وەلەرێرەوی پـیرۆنایەتی (۱) وگەوێری (۲) و مایەکیەتی (۳) رزکاریان بیێت . .

جا منی کلۆل ، هەمیشە ئەم خەیالە لەمێشکما دەمات و دەچوو چەشنی مارێـــکی بێ سرەوت هەر کێـنکلی ئەدا ، ئەم خەیالە

۱ ـ مذهب الشك ۲ ـ الانحراف ۳ ـ المادية

لەمێشکمدا دەپشکوت چەشنی درەختێك سەدەها لـق و چلی لێ ئەبۆوە ، ئەویش ئەم بیرە بڵاوانە بوون کەخۆم دروستم ئەکردن.
دەبێ کێ هەبێ بەم پرۆژە پیرۆزە هەڵسێ . ؟

چا منی کلۆل هەرچاوەڕوانی هیواو ئاواتەکەم بووم .. بەڵام بێ‌سوود بوو . . ئەمەی مەبەستم بوو ، نەدەهاتە جێ . . لەپاشدا ڕووی خەیاڵو سەرکۆنەو پرسیارم ئاراستەی خۆم کردو وتم تاکەی سەرزەنشت‌و چاوەڕووانی بەرهەمی ئابابی خەڵکی‌تر بکەم بۆ خۆم هەڵنەسم بەم پرۆژە پیرۆزە ، ئا ئەوە کاغەزو پێنووس ..

چا هەر خۆم بەخۆمم دەووت : خۆ ئەم هەوبرە ئاوێکی فرە زۆری دەوێ ، ئەمە کاری تاکە کەسێك نی‌یـە ، بەڵکو پێویستی بەلیژنەیەك لەپسپورو زاناکان هەیە ، کەلەجۆرەهـــا بەشەکانی زانست ئاگادار بن ، تابتوانن ئەو ئەرکە بەرێـوە بەرن . چا هەمیسان هەرخۆم بەخۆمم ووت سوپاس بۆیەزدانی تاك‌وتەنیاو بێ‌هاوتا . بەسەدەها پەرتووکی جۆراو جـۆر هەن کەلەهەمان مەبەست دەدووێن ، بەزمانی عـەرەبی ، کەزاناکانی جیهان بـە شێوەیەکی زانستی یانە لەهەمان مەبەستیان کۆڵیوەتەوە ، بۆکۆیان نەکەمەوە . . . خۆئەبێ مرۆڤی کۆڵ نەدەرو خاوەن بیرو باوەڕی بەخوا ، باوەڕی لەکێوی ( پیرەمەگرون ) بەهێـزتربێ وتوانای لەپۆڵا قایمتربێ ، لەپێناو ئەو ئاوات‌و ئامانجانەی کەهەمیشە بەبێ

ووچان کۆشش‌و خەباتی‌یان بۆدەکات ، بەنیازو ئامانجی گەیشتن بەکولی هیوای .. ئەوەتە بڕیارم هێنایە مەبەست‌و ڕێگای هەورازی کێوی هەزار بەهەزاری سەختم گرتە بەر بەهیوای ئارەزووی گەیشتن بەسەر لووتکەی شاخی سەخت‌و دژوار کەبولبولی خۆش ئاوازی گولعوزاری مەبەست‌و هیوام گەیشتنە بە ئامانج .

خوێنەرانی خۆشەویست‌و ئازیزم : بەڕاستی دان پێدان‌و باوەڕی بەبوونی خوا ، ڕاستی‌یەکی بنەڕەتی هەرە بەرزی هەموو بیرو بڕواو ئایینێکە ، کە ئادەمیزاد دەبێ لەســـەرەتاوە باوەڕی بە پەروەردکارێك هەبێ کەداهێنەری ئەم بوونەوەرە بووە ، تاباوەڕی بەبەشەکانی بیرو بڕوای ئایینەکانی تر بـکات . وە هەر لەبەر ئەم مەبەستە بوو ، خۆم بەبەختیارو شـــادمان زانی کەئەم پەڕتووکە پێشکەش بەخوێنەرانی گەلە خۆشەویستەکەم بـــکەم ، تا ببێتە بەردی بنچینەی خوا ناسینیان ، لەسەر بیرو باوەڕێکی پۆلایی ، لەناخــی قوولایی دەروونەوە . جا هیـــوادارو ئاواتەخـوازم لە پەروەردکاری جیهان کەوەك چرایەك دڵ‌و دەروونی خوێنەرانی پێ ڕۆشن‌و ڕووناك بکاتەوە ، بۆ باوەڕی بەخواو پێغەمبەرانی خوا .

دانـــەر

# ئایا ئەم بوونەوەرە پەروەردگارێکی هەیە ؟

بەڕاستی ئەم پرسیارە لەمێشکی هەموو کەسێکی خاوەن هۆش و بیر ، هەمیشە دێت و دەچێت ، هەر لە ناکاوێکدا دەبینی مرۆڤ دەکەوێتە دەریایەکی بێبنی پڕ لەمەترسی و ئەندێشە ، وە خولیای لەئاسمانی مێشکی پڕلەئاخ و ئەندێشە ، دەچێتە دەرەوە ، بەرەو جیهانێکی نادیار کەتێیدا بەسەرکەردانی و سەر لێ شێواوی دەسووڕێتەوە . . وەلەهەمان کاتدا بەسەدان پرسیاری تر بەمێشکی دا دێت و دەچێت ، وەلە وەلامیاندا سەرگەردان و حەیران و نەزان دەبێ وەهەر لەبەرخۆیەوە دەی لێ و دەی لێتەوە

ئایا دەبێ ئەوزەمینەی لەسەری دەژین و دێین و دەچین کێ دروستی کردبێ ؟ وە دەبێ کێ ئەوئاسمانەی کەوا مانگ و ڕۆژ و ئەستێرەکانی لەنێوان کەشکەشانی فەلەکدا بەجۆرێکی وا جوانکاری ولەسەر ڕژێم و بنکەو یاسایەکی ڕێك و پێك دروست کـردبێ ؟ هەروەها مرۆڤ هەر ڕۆژە بەسەدان پرسیاری تری بەمێشکدا دێت و دەڕوات . . جا چەشنی مارێکی بێ سەروت ئەم پرسیارانە هەرگیز ئەدەن . ئەم پرسیارانە لەمێشکیا دەپشکوتن چەشنی درەختێك چەندەها لق و چلی لێ ئەبێتەوە ، ئەویش ئەوبیرە بلاوا نەیە کەخوی دروستیان دەکا لەناکامی بیرکردنەوەیدا ، هەرلەبەر

خۆیەوە ئەڵێ و ئەڵێتەوە دەبێ کێ ئەم زەمینەو ئەم ئاسمانەی دروست کردبێ ؟ .. !! دەبێ کێ ئادەمیزادو گشت گیان لەبەرەکانی تری دروست کردبێ ؟ ئەم پرسیارانە لێی دەبنە شاخێکی زۆر بەرزی دژوار ، جا پیاوی داماوو حەپرانو سەر لێ شێواوو شەمزاو ، ئارەزووی گەیشتنی سەرلوتکەی ئەکا ، بەڵام ڕێگا سەختەو پڕ لەمەترسی‌یە هەموو کەس ناتوانێ بیکات بەتاوی سازکار کەلەسەر لوتکەی بەرزی شاخەکە دەست دەکەوێ کەوا مێشکی تینووی پڕلەئەندێشەی پێ ئاوبداو دڵی زامداری دیداری ئەوینی پەروەردگارێکی بێ هاوتای نادیارە کەهەمیشە دڵی‌سرەوت ناگرێ بۆدۆزینەوەی کەوا دڵی برینـــداری ، وەك مەلحەم پێ سارێژ ببێت .

ئنجا هەر دەرفەتێکی بۆبلوێ گـرێی هەگبەی پرسیارەکانی دەکاتەوەو یەك لەدوای یەك ئاڕاستەی ئەوکەسـانەی دەکات ، کە بزانێ کەمێك شارەزایی‌یان لەوەڵام دانەوەیاندا هەیـــە ، بەڵام بەداخەوە زۆر جار ناکەنە هیـــچ مەرامو ئەنجامێك کەکاکەی پرسیارکەر تینووی بەوەرام دانەوەو بەڵـگەکانی کاکەی پرسیار لێ‌کراو بشکێ . ئنجا بەدڵ شکاوی‌و مچو مۆری ، لەپاش مشتو مڕێکی زۆر یەکتری بەجێ دەهێڵن ، وەیاخود زۆر جاریش وا دەبێ بەکژ یەکدا دەچن لەبەر بێ‌سەلیقـەیی پرسیار لێ‌کـراوو

بۆمێزی بەڵگەکانی کەکاکەی پرسیار کەر بڕی پێیان ناشکێ‌و مێشکی پێیان ناخواتەوە . . .

زۆر جاریش وادەبێ منداڵ پرسیاری واکەرنگ ناڕاستەی باوك‌و مامۆستاکەی دەکا ، دەربارەی بوونی خواو پەروەردکاری جیهان کەباوك‌و مامۆستا ڕاستەو خۆ ناتوانن وەڵامیان بدەنەوە . وەزۆر جاریش وادەبێ لەبەر کەم سەلیقەیی‌و کەم شارەزایی‌یان لەبارەی بوونی خوا ، خۆیان لێ کەر دەکەن ، وەیاخود لەبەر بایەخ نەدان بەپرسیارەکەی ، بەڵام منال هەر ڕژد دەبێ لەسەر وەڵامی پرسیارەکەی‌و دووپاتی دەکاتەوە . جا بەناچاری وەڵامێکی دوور لەئەقل‌و مەنتیقیان دەدەنەوە کەوا منـال تینوێتی پێ‌و ئەندێشەی پێ ناوناخواتەوە ، ئەمجا منالی چالاك‌و زیرەك جارێکی تریش دووبارە پرسیارەکەی ناڕاستەیان دەکاتەوە ، ئنجا لەبریق وەڵام دانەوەیەکی ڕاست‌و سەلمێنەر هەڕەشەی لێدەکەن کەوا جارێکی‌تر ، هەرگیز ئەم جـۆرە پرسیارانە نەکاتەوە ، چونکە باش نی‌یە لەبوونی خواو پەروەردکاری جیهان بکۆڵینەوە

وەزۆر باوك‌و مامۆستـاش هەن کەبەبەڵـگەی سەلمێنـەرو سینگێکی فرەوان‌و ڕوویکی خۆشەوە وەڵامی منالەکانیان دەدەنەوە وپێیان دەسەلمێنن کەخوا هەیەو هەرئەوە پەروەردگاری جیهان .

جا منیش وەك ئەوباوك‌و مامۆستایانە دووچاری وەڵامدانەوەی

ئەم پرسیارانە بووم لەلایەن جگەرگۆشەی زۆر خۆشەویستەو ئازیزم ( ئازاد ) جا وا بۆخوێنەرانی بەرێزی دەخەمە بەرچاو تاکو ئەوانیش بەش بەحالی خۆیان ئاگادار بن لەمەترسی نەشارەزاییان لەوەلاّم دانەوەیان ، ئەگەر هاتوو وەکو من ئەو پرسیارانەیان لێ کرا لەلایەن جگەرگۆشەکانیان وەیاخود لەلایەن خەلکی ترەوە . وەپوختەی گفتوگۆیەکانمان بەم شێوەی خوارەوە دەستی پێ کرد :

ئازاد ، باوکەکیان

کێ ئێمەی دروست کردووە ؟

کێ ئەم هەموو درەختانەی دروست کردووە ؟

کێ ئەم زەمینەی دروست کردووە ؟

کێ ئەوئاسمانو مانگو رۆژو ئەستێرانەی دروستکردووە ؟

کێ ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە ؟

جا منی کلۆل ، لێرەدا کەوتمە گێژاوێکی ئەندێشەی پرلەمەترسیەوە ، راستەوخۆ وەلاّمم نەدایەوەو کەمێك خۆمم لێ کەر کردو خۆم لەدەریایی بیرو ئەندێشەدا نقوم کرد تا ماوەیەکی کەم ، جا دووبارە ئازاد هەمان پرسیارەکانی لێ کردمەوە ، منیش ناچارمام کەچیتر خۆم خەریك نەکەمو وەلاّمەکەی دوا نەخەم ، چونکە زانیم کەهەر زۆر سوورە لەسەر وەلاّم دانەوەی پرسیارەکانی

لەلایەن منەوە ، جا منیش پێش ئەوەی وەرامی پرسیـــارەکانی بدەمەوە ، ئەم پرسیارانەی خوارەوەم ئاراستە کردو وتم

ئازاد گیان : ئایا دەزانی ئەو کورسی یەی لەسەری دانیشتووی کێ دروستی کردووە ؟

ئازاد ، بەڵێ ، باوکە گیان . دارتاش دروستی کردووە

ئایا دەزانی ئەوخانووەی لەناویا دەحەوێنیـــەوە کێ دروستی کردووە ؟

ئازاد ، بەڵێ باوکە گیان ، وەستاو کرێکار دروستیان کردوە .

ئایا دەزانی ، ئەوقوتابخانەیەی تیایدا دەخوێنی ، کێ دروستی کردووە ؟

ئازاد ، بەڵێ باوکە گیان میری دروستی کردووە ، کەپێشەکی پارەیەکی زۆری بۆتەرخان کردووەو داویتی بەبەڵێندەر ، ئەویش بەهاوکاری سەدان کرێکارو وەستاو دارتاش و ئاسنگەرو کارەباچی و زۆری تر کەتوانیویانە پاش کۆشش و ماندو بوونێـکی زۆر لە ژێر چاودێری ئەندازیارێکی شـــارەزادا کەئەوقوتابخانەیە بەم شێوە جوانەی دروست بکەن .

ئایا دەزانی ئەم کات ژمێرەی لەدەستت دایە کێ دروستی کردووەو بۆچی دروست کراوە ؟

ئازاد : بەڵی باوکە گیان ، وەستایـەکی زۆر زاناو شارەزا

دروستی کردووە بۆکات زانین .

کاپا ئەشێ بڵێین : ئەم کات ژمێرە ، هەرلەخۆیـــەوە ، بەبێ وەستا دروست بووە ؟

ئازاد : نەخێر ، هەرگیـز شتی وا نەبووەو نابێ کەوا شت هەربەخۆ بەبێ دەستی هێزدارو زانایەك دروست بێ ، چونکە قسەی وا قسەیەکی شـــەو نابایی‌و پـرو پووچو بێ مانایە وەلە تەرازووی ئەقڵو مەنتقیشدا کێشی بۆنی‌یە لەبەر بێ‌بەڵگەیی .

جا باشە ، کوری ئازیزو شیرینم ، تا ئێستا بۆت ئاشکرا بوو کە هەرشتێك هەرچەندە بچووك بێ ، وەکو کاتژمێر و کورسی . . وەیا هەرچەندە گەورەبێ وەکو ئوتابیخانەو زۆر شـــتی‌تر ، دەبێ دروست کەرێـــکی هەبێ ، ئەمجا چۆن دەشـــێ ئەو بوونەوەرە پەروەردگارێکی نەبێ کەلەسەرەتاوە دروستی کردبێ . ؟!!

ئازاد : بەڵێ راستە باوکەگیان . . بەڵام ئەو پەروەردگارە کێیە ؟

کوری شیرینم : ئەوپەروەردگارە ئەو دلهێنەرە بەتواناو بە هێزو زانایەو دانایەیە کەهیچ هاوتای نی‌یە وە هەرئەوە کەزەمینو ئاسمانو رۆژو مانگو گشت ئەستێرەکانی دروست کردووە لەگەڵ ئەوهەموو شتانەی کەتیـــایدا هەیە ، وە هەر ئەوە ئێمەو گشت گیانەوەرێکی دروست کـــردووە ، هەرئەوە جۆرەها درەخت و

ڕووەکی تری دروست کردووە .

چا مرۆڤی هۆشمەندو ژیر ، ئەگەر بێتو بەووردی سەرنج بداتە ئەوبوونەوەرەو بیرکاتەوە ، باش بۆی ئاشکرا دەبێ کەئەو ئاسمانە پانو بەرینە هەروەك کۆشكو تەلارێکی بەرز وایە کەبە شێوەیەکی ئەندازیاری ڕێكو پێكو قەشەنگ دروست کراوە کە مرۆڤی خاوەن هۆشو بیر ، سەری سوڕ دەمێنێ لەچۆنیەتی بنیات نانی وهاتوو چۆی مانگو ڕۆژ بەو شێوە ڕێكو پێکە کەمرۆڤی ژیرو ئەستێرە ناس لەکاری نهێنی ئەو هاتوو چۆیەدا حەیرانو سەرلێشێواوو سەرگەردان دەبێ ، تا لەئاکامی بیر کردنەوەیدا دەگاتە ئەوقەناعەتەی کەدەبێ پەروەردگارێکی یەکجار بەدەسەلاتو تواناو زانا هەبێ کەئەوبوونەوەرەی بەهەموو شتێکەوە لەسەرەتاوە دروست کردبێ ، وەئەویاسا ڕێكو پێکەی بۆدانابێ کەئەقلی ئادەمیزادی زۆر پسپۆڕو زانای تیا سەرگەردانە لەچونیەتی دروست کردنیا .

× × ×

# ئایا ڕاستە ئەڵێن ئەوەی بەچاو نەبیندرێ
# نابێ بڕوای پێ بکرێ ؟

بەڕاستی خوا نەناسەکان نەدیتنی خوا دەکەن بەبەڵگەیان کەوا خوا نی‌یە ، وەزۆر کەسیش گیرۆدەی داوی بیرو بڕوا پڕوپوچەکانیان بوون وگومڕاو سەرلێ شێواو بوون ، وەهەر کاتێك گفتو گۆیان لەگەڵدا بکەیت دەربارەی بوونی خواوەند ، ڕاستەو خۆ پەنا دەبەنە بەر ئەم پرسیـارانەو ئەڵێـن : ئەگەر ڕاست دەکەن کەوا خوا هەیە بۆ نایبینین ؟

لێرەدا منیش بەرلەوەی وەڵامی ئەم پرسیـارەیان بدەمەوە ، ئەم پرسیارانەیان ئاراستە دەکەم وئەڵێم

ئایا بڕواتان بەبوونی ( با ) هەیە یان نا ؟

بی‌گومان لەوەڕلم دا ئەڵێن : بەڵێ ، بڕوامان بەبوونی (با) هەیە .

وەئەگەر دیسان پرسیاریان لێ بکەیتو بڵێی

لەبەرچی بڕواتان بەبوونی ( با ) هەیە ، خۆ بەچاویش نابیندرێ؟

بێ‌گومان لەوەڵامدا ئەڵێن : چونـکە بەچاوی خۆمان دەبینین کەوا زۆرجار ڕەشەبا درەختی گەورە لەڕەگو ڕیشەوە دەردەهێنێ وە زۆرجاریش وایە کەوا کڵاوو جامەدانی لەسەر سولر دەفڕێنی.

جا منیش دەڵێم : خۆ ( با ) بەچاو نابیندرێ ، بۆچی بڕواتان

بێ ی هەیە ؟

ئەنجا بەناچاری دەڵێن : چونکە هەست بەتەوژمی دەکەین کەوا شوێنەواری دیاردەیەکی ئاشکرایەو هەموو کەسێك هەست بەبوونی دەکا هەرچەندە بەچاویش کەس ناتوانێ بیبینێ .

وەهەروەها ئەگەر لێیان بپرسی و بڵێی : ئایا بڕواتان بەهێزی راکێشانی موگناتیس هەیە ؟ بێگومان لە وەڵامدا ئەڵێن : بەڵێ بڕوامان پێی هەیە . وەئەگەر دووبارە لێیان بپرسی و بڵێی :

بۆچی بڕواتان پێی هەیە ، خۆ ئەوهێزەی کەشت بۆخۆی رادەکێشێ بەچاو نابیندرێ ؟

بێگومان لەوەڵامدا ئەڵێن : چونکە بەچاوی خۆمان دەبینین ئەگەر بێت و بزمارێك وەیاخود ووردە ئاسن لەپارچە موگناتیسێك نزیك بکەینەوە ، خێرا بۆخۆی رای دەکێشێ وە بەهۆی ئەو راکێشانەوە دەزانین کەوا هێزێکی نادیار لەناو ئەو پارچە موگناتیسە هەیە کەئەوبزمارو ووردە ئاسنانە بۆخۆی کێش دەکات .

دیسان ئەگەر لێیان بپرسی و بڵێی :

ئایا بڕواتان بەهێزی تەوژمی کارەبا هەیە ؟

بێگومان دەڵێن بەڵێ بڕوامان پێی هەیە ،

وەئەگەر دووبارە لێیان بپرسی و بڵێی : خۆ ئەوهێزەی لەناو تەلەکانی کارەبا هەیە بەچاو نابیندرێ ، بۆچی بڕواتان پێی هەیە ؟

بێ گومان لەوەرام دا ئەڵێین چونکە شوێنەواری دیاردی‌یەکی ئاشکرایە ، بەچاوی خۆمان دەبینین کەبەهۆی ئەوهێزەوە گڵۆپەکانی شارەکەمان هەموو شەقام و کۆڵان و ماڵەکانمان ڕووناك دەکەنەوە .

دیسان ئەگەر لێیان بپرسی و بڵێی

ئایا بڕواتان بەگیان ( روح ) هەیە کەلەبەر هەموو گیانلەبەرێکدا هەیە ؟

بێ گومان دەڵێین : بەڵێ ، بڕوامان پێی هەیە ،

وەئەگەر دووبارە لێیان بپرسی و بڵێی گیان چی‌یە ؟ لەوەڵامدا بەناچاری و سەرلێ شێواوی ئەڵێین

نازانین گیان چی‌یە ، چونکە هێشتا پسپۆرە زۆر زاناکانی جیهان لەرازی گیان سەرگەردان و نەزانن . .

وە دیسان ئەگەر لێیان دووپات بکەیەوە و بڵێی :

ئایا هیچ ئەندامێك لەلەشی گیان لەبەرێك پێی ئەڵێین ئا ئەوە گیانی گیان لەبەرەکەیە ؟

مسۆگەر لەوەڵامدا ئەڵێین : نەخێر

وەهەروەها ئەگەر بێتو لێیان بپرسی و بڵێی

ئایا بڕواتان بەبوونی ئەقڵ لەمێشکی ئادەمیزاد دا هەیە :

بێ گومان لەوەڵامدا ئەڵێین : بەڵێ بڕوامان پێی هەیە وەلەهەمان کاتدا ئەگەر لێیان بپرسی و بڵێی

ئایا دەتوانن ئەقڵمان نیشان بدەن ، وەیاخـود وەسپمان ( وسفمان ) بۆبکەن کەوا ڕەنگی سپـی‌یە وەیا ڕەشە وەیاخـود قەوارەکەی بچووکە وەیا گەورەیە ؟

بێ‌گومان بەناچاری لەوەڵامدا ئەڵێن نەخێر لەپاش ئەم گفتوگۆو پرسیارو وەڵامانەدا ئەگەر بێت‌و لێ‌یان بپرسی‌و بڵێی: ئەگەر ڕاست دەکەن کەوا بڕواتان بـەبوونی باو هێـزی تەوژمی کارەباو کێشی موگناتیس‌و گیان‌و ئەقڵ هەیە ، کەوا بـە چاویش نابیندرێن ، بۆچی بڕواتان بەبوونی خواوەند نی‌یـــە کەوا ئەو سیفەتانەی لەخوا بەدی دەکرێ ، زۆر گرنگ‌تر وئاشکـرا ترن لەوسیفەتانەی کەوا لەباو هێزی تەوژمی کارەباو کێشی موگناتیس وگیان‌و ئەقڵدا بەدی دەکرێ .

بەڕاستی لێرەدا ئادەمیزادی هۆشمەندو ژیر ، ئەگـەر خۆی تەفرە نەداو خۆی گێل‌و گەوج‌و گومڕا نەکاو لەهەق‌و ڕاستی ڕانەکا وبیر لەنەفسی خۆی‌و ئەندامەکانی لەش‌و زەمـین‌و ئاسمان‌و ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەکان‌و کێوو دەریاو رووبارەکان‌و گشت درەختەکان بکاتەوە وچاوی لەزەمینەوە هەڵبڕێ بۆئاسۆی ئاسمانی پان‌وبەرین وبەووردی بیری لێ‌بکاتەوە چا ئەوکاتە بۆی ئاشکرا دەبێ کەوا ئەومانگ‌و ڕۆژو ئەستێرانە گشتیان بەڵگەو شایەدی بوونی خوان، چونکە پێویستە بـۆ بوونی هەر دروست کـــراوێ با هەرچەندە

بچووك بێ وەیا گەورەبێ ، دروست کەرێکی هەبێ ، جا چۆن ئەشێو ئەقلی کێ ئەی سەلمێنێ کەوا دەرزی یـــەك بـەبێ وەستا دروست ببێ ، بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە بڵێن ئەوبوونەوەرە بەوڕێكو پێکی یەو هەرلەخۆیەوە دروست بووبێ ، بەبێ داهێنەرو پەروەردگارێك ؟ !!

جا ئەوکەسەی ئەگەر تۆزقاڵێك هۆشی هەبێ ئەڵێ بەڕاستی ئەو یاسایەی ئەم جیهانەی لەسەر دروست بووە کەوا زۆر بەڕێك وپێکی دروست کراوە . پێویستە ( پەروەردگارێکی هەبێ ) کەوا لەسەرەتاوە دروستی کردبێ ، وە زۆر بەتواناو داناو زانابێ ، وە جیاوازیشی هەبێ لەهەموو سیفەتێکی ماددیەت کەوا هەمووگیان لەبەرێكو شتی تری لێ دروست کراوە .

وەهەروەها ئەڵێن : جارێکیان لەپیـــاوێکی نەخوێندەواری موسوڵمانیان پرسیو پێیان ووت

چۆن خوات ناسیو بڕوات پێ ی کرد کەوا هەیە ؟

لەوەڵامدا ووتی : کەسەیرم کرد هەرشوێن پێنخوستێك کەلەسەر زەویدا بەدی دەکرێ ، دەبێ کەسێـك وەیا گیان لەبەرێـــك بەسەریا ڕۆیشتبێ ، ئنجا پەیدا بووبێ ، جا بۆم ئاشکـرابوو کە بوونی ئەم جیهانەو ئەوڕۆژو مانگو ئاسمانە ، هەرلەخۆیەوە دروست نەبووە ، دەبێ دروست کەرێکی هەبێ کەئەویش خوای تاکوتەنیایە .

# ئایا خوا لەدنیـا دەبیندرێ ؟

بەرلەوەرام دانەوەی ئەم پرسیارە دەمەوێ چەند راستی یەکتان بۆ روون بکەمەوە ، جا وەلآمی پرسیارەکەتان بدەمەوە .

بەراستی زانایانی ئاینی ئیسلامی پیرۆز ، دەربارەی بینینی خوا ، زۆر قسەیان لێ کردووەو زۆریان لێ کۆلیوەتەوە . . وەلە ئەنجام دا گەیشتوونەتە ئەوبیرو باوەرو قەناعەتەی کەدیتنی خوا لە دنیادا ستەمو نابایی یە وەبەلـــگەشیـان ئەم فەرموودانەی خواو پێغەمبەرمانن کەلەسەر هەمان مەبەست فەرموویانە لەرەتدانەوەی ئەوکەسانەی کەداوای دیتنی خوایان کردوە .

خواوەندی مەزنو بێهـاوتا ، دەربارەی سەرگـــوزەشتەی حەزرەتی مووسا پێغەمبەرو خۆیدا ، بۆمان دەگێرێتەوە لەقورئانی پیرۆزداو دەفەرموێ :

(قَالَ: رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ ، قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِـــنْ انْظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي ، فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكّاً وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقاً . . ) [١]

لەپاش ئەوەی خوای گەورەمان بەڵێنی بەحەزرەتی مووسادا کەلەدوای چل شەودا ، پەرتووکێکی بۆ رەوانە دەکا کە بگـونجێ

---

[١] سورة الاعراف : ١٤٣

بۆ ڕێ نوێتی‌و ڕێ نیشاندانی گەلەکەی .

حەزرەتی مووسا درووددی خوای لێبێ ، هارۆونی برای‌کرد بەجێ نشینی خۆی وەلە ڕۆژی دیاری کراو ڕۆیشت بۆ خزمەتی خوا . . لەکاتی گفتوگۆدا حەزرەتی مووسا درووددی خوای لێ‌بێ داوای لەخوا کرد کەوا خۆی پێ نیشان بدات .

خوا پێی فەرموو : ( یامووسا ) ئەمە شتێکی نابایی‌یەو نابێ چونکە تۆناتوانی من ببینی . وەلێرەدا خـــوداوەند ویستی ڕاستی ئەوەی پێ نیشان بدا کەوا ناتوانی خوا ببینی بۆدڵنیایی حەزرەتی مووسا . فەرمانی پێ‌کرد کەسەیری چیا بکات . لەهەمان کاتدا خواوەند تیشکێک لەڕۆشنایی خۆی نیشانی کێوەکەدا ، کێوەکە کەوتە لەرزە ئەرزو شەق بوون . کەحەزرەتی مووسا ئەمەی بینی یەکسەر کەوتە سەرزەوی‌و لەترسا بوورایەوە . .

کەبەهۆش هاتەوە فەرمووی : پەروەردگارا ! من پەشیمانم لەدلوا خوازی‌یەکەم ، بم بەخشە ، وا من بەڵێنم تازە کردەوە کەوا یەکەمین کەسم کەبڕوام بەگەورەیی‌و توانایت هەیە .

وەهەروەها خوداوەند دەربارەی هەمان مەبەست فەرموویەتی :
( لَاتُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَيُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ) [١]
واتە : هیچ کەسێک توانای بینینی خوای نی‌یە ، بەڵام ئەو

---

[١] سورة الانعام : الآية (١٠٣)

بەچاوی توانایی ، هەموو شتێك دەبینی ، وە ئاگـاداری بەهەموو کارو کردەوەی بەندەکانی هەیە ، هەرچەندە بەنهێنیو بەئاشکراش بکرێن .

وەهەروەها پێغەمبەریشمان درووودی خوای لێ بێ دەربـارەی هەمان مەبەست فەرمویـەتی : ( وَٱعْلَمُوا إنكُمْ لَنْ تَرَوا رَبَّكُـمْ حَتَّىٰ تَمُوتُوا )

واتە : ئێوە پەروەردگارتان نابینن ، ئەی خاوەن بڕواکان : تاکو نەمرن ، واتە لەقیامەت دا دەی بینن .

ئەمجا ئێمە لەوەرامی پرسیاری پێشودا ئەڵێین : نەخێر ، هەرگیز خوا لەدنیادا نابیندرێ ، بەڵگەشمان ئەم فەرموودانەی خواوەندو پێغەمبەرمانن (١) جا هەر قسـەیەك لەم بارەیەوە بکرێ دەربارەی بینینی خوا لەدنیادا بەتاڵو بێنرخە لەتەرازووی ئەقڵو زانسـتو ئایین دا .

---

١ ـ وەهەروەها خوای گەورە ئەوەندە زانستی پێنەداوین کەبە تەواوی لەویگەین وبزانین چۆنە وەکـــو لەقورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی : ( وما أُوتيتُمْ مِنَ العلم إلا قليلاً ) .

# ئایا خوا لەقیامەت دا دەبیندرێ ؟

بەر لەوەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە ، دەمەوێ چەند بەڵگەیەکی سەلمێنەرتان بۆبهێنمەوە ، جا وەرامی پرسیارەکە بدەمەوە .

بەراستی زانایانی ئیسلام ، دەربارەی دیتنی خواوەندی گەورە وبێ هاوتا ، زۆریان لێ کۆڵیتەوە .. وەلە ئاکام‌دا گەیشتوونەتە ئەو بەو باوەڕو قەناعەتەی کەپیاوچاکان لەقیامەت‌دا خوا دەبینن بەبێ هیچ گومان‌و دوودڵی‌یەکەوە ، وەبەڵگەشیان ئەم فەرموودەی خواو پێغەمبەرمانن کەلەسەر هەمان مەبەست فەرموویانە :

خواوەند دەربارەی حاڵی پیـــاوچاکان لەڕۆژی قیامەت دا فەرموویەتی : ( وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ . إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ) [١]

واتە : لەڕۆژی قیامەت دا ، روخساری پیاوچاکان جوان و گەشاوەیە ، وەتەماشای جوانی خوا ئەکەن بەچاوی سەر بەجۆرێ کەئەقڵ‌و زمان کۆڵن لەزانینی وەسفو بەیانی .

وە هەروەها پێغەمبەرمان دروودی خوای لێ بێ فەرموویەتی دەربارەی هەمان مەبەست : ( إنكم سترون ربكم كما ترون القمر ليلة البدر )

واتە : ئێوە ئەی خاوەن ئیمانەکان لەڕۆژی قیـامەت‌دا ،

---

[١] سورة القيامة : الآية (٢٢) - (٢٣)

پەروەردگارتان دەبینن ، هەروەکو مانگ لەچواردە شەوی دادەبینن .

جا لەوەرامی پرسیاری پێشودا ئەڵێم : بەڵێ ، خوا لەڕۆژی قیامەتدا دەبیندرێ لەلایەن ئیمان دارەکانەوە لەبەهەشت دا بەبێ هیچ گومانو دوودڵی یەکەوە .

## ئایا ڕاستە ئەم جیهانە هەرلەخۆیەوە بە ڕێکەوت دروست بووە بەبێ ئەوەی داهێنەرێك دروستی کردبێ ؟

لێرەدا دەمەوێ بەرەی هەس پان بکەمەوە بۆئەوبەدبەختەو داماوو گومرابوانەی کەگومانیان لەبوونی خواوەند هەیەوئەڵێن : گوایە ئەم جیهانەهەرلەخۆیەوە دروستبووە وەبەبێ بەڵگەی ماتوولوسەلمێنەر هەر بەنەماندنو گومانی دوور لەڕاستی ، کەوتوونەتە دواهەوەس وئارەزوو بێدوباوەری پڕوپووچو ، بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێك بیرلەحاڵی شەمزاوو پەرێشانی خۆیان بکەنەوە ، وەبیر لەوبوونەوەرە بکەنەوە کەچۆن دروست بووەو کێ دروستی کردووە . . تا پەردەی گومان وگومرانیان لەسەر چاوی دڵیان لابدەم ، بەهۆی تێشکی لێکۆڵینە وەیەکی بەراوردی زانستیانە ، بەتەرازووی هۆش بیرەکیو ژیر

پێژەییش بۆیان ساغ بکەمەوە وپێیان بسەلمێنم کەوا ئەو بوونە ـ وەرە هەرلەخۆیەوە دروست نەبووە . .

جا لێرەدا ئەگەر لەگەڵیان بکەوینە گفتوگۆو پرسیاریان لێ بکەین وبلێ ین :

بەڵگەی ڕاستو دروستو سەلمێنەرتان چی یە لەسەر نەبوونی خوا ؟

وەبەڵگەی ڕاستو دروستو دوور لەگومانو نەماندتان چی یە کەوا ئەوبوونەوەرە هەرلەخۆیەوە بەشێوەیەکی هەرەمەکی وڕێکەوت دروست بووە ؟ مسۆگەر لێرەدا بێدەنگ دەبنو خامۆشی دایان دەگرێتەوەو واقیان وردەمێنێ لەبەر بێ بەڵگەیی نازانن چی بلێن ..

وەلەهەمان کاندا ئەگەر ئەوان ڕووی پرسیاریان ئاراستەی ئێمە بکەنو بلێن : باشە ، ئێوە بەڵگەی ڕاستو سەلمێنەرتان چی یە لەسەر بوونی خوا کەوا ئەم بوونەوەرەی لەسەرەتاوە دروست کـــردووە ؟ ئێمەش یەر لەوەڵام دانەوە کەمان ، ئەم ڕووداوەی خوارەوەیان بۆدەگێڕینەوە تا بەخۆیان شیتەڵی بکەنەوە وبگەنە بنجو بنەوانی ڕاستیو قەناعەت ، وەهـــەر خۆشیان دەکەین بە ناوبژی کەرو ڕاست ڕەو ، تا هەرلەخۆیان بەبێ لایەنیی لەبریق ئێمەش وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوەو ڕاست بە ڕاستو درۆ بە درۆ بخەنەوە

ئەگەر پیاوێك بێتو سوێندمان بۆبخواو بلێ چەند ڕۆژێك لەمەوبەر ، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکمدا چووبووین بۆسەیران ، لە سەیرانگاکانی دامێنی کێوی گـۆیژە ، لەهەمان کاتدا کەخەریکی کەیفـو بەزم بووین ، بینیمان پارچە شاخی زۆرگەورە لەقەدپاڵ لوتکەی کێوەکەوە دەکەوتنە خوارەوەی . . وەیەکسەر دەبـوون بەناسنو لاستیكو تەختەدار ، وەسەربەخـــۆ کەوتنە جوڵەو بۆ یەکتری دەهاتنەوە ، هەرئەوەندەی بلێی یـــەكو دوو بەچاو ـ تروکاندنێك ، دیتمان پاسێکی گەورەی وەك ئەوپاسانەی لەخەتی بەغداو سلێمانی ئیش دەکەن لێیان دروست بـوو ، هەرلەهەمان ساتو کاتدا ، دەستی کرد بەگڕە گڕو ئیش کردن بەبێ بەنزینو شوفێر ، یەکسەر ، ڕووی لەئێمە کـــردو لەنزیکمان ڕاوەستاو هۆرنی بۆلێداین تاکو سواری بینو ئێمەش سواری بووینو پێی هاتینەوە بۆسلێمانی وەلەگەراجی خەتی بەغداو سلێمانی دابەزینو بینیمان لەسەری نووسرابوو : سلێمانی ـ بەغـدا . پاش کەمێك سەیرمان کرد پڕبوو لەنەفەرو دەستی کرد بەڕۆیشتن بۆبەغدا .. وەئێستاش هەمان پاس وا زۆر بەرێكو پێکی لەخەتی نێوانـــ سلێمانیو بەغدا ئیش دەکا بەبێ شوفێـــرو بەنزین وەلەهەمـوو قۆناغێکی ڕێگاکەشدا ڕادەوەستێ تا نەفەرەکان بحەسێنـەوە ، جا دەست بەڕۆیشتنەکەی دەکاتەوە . . !

جا هەر کەسێك ئەم باسەی گوێ لێ بێت وەیاخود ببیستێ ئایا دەبێ چی بلێ . ؟!!

ئایا راستەو خۆ نالێ ( بەخوا درۆیەکی زۆر زلە ) هەرگیز کەس نەی توانیوەو جەسارەتی نەکردووە ، درۆی وارێك بخات وبکات ؟

وەیاخود لەقاقای پێکەنین دەداو ئەلێ ، زۆر شورەیی یە کاکە ئەم قسە درۆیە بەبەردەم خەلکی تر مەخە .

وەیاخود ئەلێ کابرا تۆ هورێنە دەکەی یا شێت بووی ؟!

ئنجا بەرێزان بۆبەم قسەیە ئەلێن درۆو بەوقسەیەش ئەلێن راست کەئەو کەسەی بەبێ بەلگەی راستەو سەلمێنەر ئەلێ ئەم جیهانەو رۆژو مانگ‌و ئەستێرانە لەخۆیانەوە بەرێکەوت دروست بوون ..!!

ئایا دروست بوونی پاسەکە بەرێکەوت گرنگترە لەدروست‌بوونی ئەم جیهانەو رۆژو مانگ‌و ئەستێرانەو نادەمیزادو زەوی‌و گشت شتەکانی تر . . ؟

ئایا هاتووچۆی مانگ‌و رۆژ بەبێ بەنزین‌و شوفێر لە ئەوبەری کەشکەشانی ئاسمانی پان‌و بەرین بـــۆئەم بەری سەیرترە یاخود هاتوو چۆکردنی پاسـەکە ؟ ! ئایا دروست بوونی مانـگ‌و رۆژ بەرێکەوت گرنگترە یاخود دروست بوونی پاسەکە ؟!

بەخوا ئەوکەسە زۆر سەیرە کەدروست کـردنی دەرزیی پێ

گرنگترین لەدروست کردنی فرۆکەو ئۆتۆمۆبێل و شەمەندەفەرو کەشتیو موشەکو ئەتۆم . !!

لێرەدا مرۆڤی هۆشمەند کەمێك بیربکاتەوە بۆی ئاشکرادەبێ کەوا دروست بوونی هەرچییەك لەم جیهانەدا هەیە بەرێکەوتو شێوەیەکی هەڕەمەکی ، قسەیەکی بەتاڵو پڕو پووچو ترۆهاتو بێ ماناو بێبەڵگەیە . چونکە زانست ڕوونی کردۆتەوە ، هەرشتێکی بەرێکەوت دروست ببێ وبێتەکایەوە ، ناشێ ئەمە دووبارە ببێتەوە بەرێكو پێکی وەك دروست بوونی مانـــگو ڕۆژ کەبەم شێوەیە بەردەوام دووبارە ببێتەوە بەرێكو پێکی ، هەریەکەیان لەدەورەی چەرخی فەلەکی خۆیان بسوورێتەوە . بەهۆی زانـست ئاشکرابووە لەلایەن ئەستێرە ناسان ، کەهەر ئەستێرەیەك لەئەستێـرەکان لە چەرخی فەلەکی دیاری کراوی خۆی دا دەربچێت ، جیهان بەچاو تروکاندنێك تەختو وێران دەبێت . . . جا چـــۆن ئەشێ ئەو یاسایەی ئەم بوونەوەرە لەسەری دامەزراوە بەرێکەوت وهەڕەمەکی بەوشێوە رێكو پێکە دروست ببێت کەئەقڵی ئەستێرەناسانـــو پسپۆران وگشت زانایانی جیهـــان لەهەوودەو رازی چۆنییەتی دروست بوونیان سەرگەردانو حەیرانە .. ئنجا ئایا ئەقڵومەنتیق ئەم قسەیە قەبوول دەکا کەوا ئەوبـوونەوەرە ، هـــەر لەخۆیەوە بەرێکەوت دروست بووبێت ؟ !!

ئایا بۆدروست کردنی ئەو بوونەوەرە پێویست بەئەندازیارێکی یەکجار شارەزاو زاناو داناو بێهاوتا ناکات ؟

وەیاخود دروست بوونی کرۆمۆسۆمات وسایتۆپلازم و پرۆتۆپلازم لەهەوەل جاری یەوە لەماددەی بێ گیــــان . . وەهەروەهــا دروست بوونی سێلەکان لەسەرەتاوە بەرێکەوت لەوانیشەوە هەر بە رێکەوت گشت زیندەوەرو رووەکی تریان لێدروست ببێ . . .

جا ئەم زیندەوەرە نێرو ئەوی تریان مێ ، وەئەوەیان بەهۆی زاوو زێ زۆر دەبێ وئەوی تریان هێلکە دەکا . . وەئەوەیان باڵی هەیە ودەفرێو ئەوی تریان نافرێ . . ئایا ئەمانە هەمــوو بەشێوەیەکی هەرەمەکیو رێکەوت سروشتی کەرو لاڵو بێ هــۆش و بێ هەست دروستی کردوون ؟ !!!

ئایا ئەقڵو مەنتیقو زانست ئەمە قەبوول دەکا کە بڵێین وبڕو پاگەندە بکەین ، کەسروشت ئەم نادەمیزادەو گشت زیندەوەرەکانی تری دروست کردووە بەوشێوە جوانە ؟!

باشە ، ئەگەر راستە بۆ هەتا ئێستا نەمان بینی ونەمان بیست کەوا سروشت بەرێکەوت قوتابخانەیەك وەیا قەڵایەك وە یا تاکە ژوورێك ، وەیا کات ژمێرێك ، یا دەرزیەك دروست بکات ، تا قەناعەتمان بێت کەوا زەویو ئاسمانو ئەستێرەکانیش بەرێکەوت ( سروشت دروستی کردوون ) . !!

وەیاخود بۆزەوی نەبوو بەماکو سەرچاوەی دروست بوونی ئادەمیزادو گشت زیندەوەرەکانی‌تر لەبری ئەوزاوو زێیەی ئێستا هەیە ، بەپێی ئەوتیۆرەی ئەلێ : گوایا ئادەمیزادو گشت گیان لەبەرەکانی تر ، لەسەرەتاوە لە بەکتریاوە بەگۆیرەی ئەوفراژو گۆڕانانەی بەسەریاندا هاتووە بەدرێژایی ڕۆژگار بوونە بەو ئادەمیزادەو ئەوگیان لەبەرانەی کەئێستا هەنە . . !!

ئەمانە گشتیان لەلایەکەوە ، گریمان زەوی وەیاخود بلێین سروشت بەهەرجۆرێك بوو پیاوێکی لەهەوەڵەوە دروست کرد ، باشە چۆن ئەقلی پیا شکا وتوانی ئافرەتێکیش لەچەشنی ئەو پیاوە دروست بکاو کەلەچەند خاسیەتێك لەگەڵیا جیا بێت کە بشێتە بۆزاوو زێ بەهۆی نزیك بوونەوەیان لەیەکتری . !!!

ئایا دروست بوونی شتی وا ستەمو نابابی نی‌یە کە هەرگیز ئەقل ئەمە ناسەلمێنێ ؟!

# ئایا ڕاستە زۆرترینی زانایانی جیهان بڕوایان بەبوونی خوا نی‌یە ؟

هەندێ کەس لەوانەی کە بێ‌بەهرەو بێ‌بەشن لەزانست ، وە یاخود بەهۆی کەم شارەزایی‌یان نەگەیشتوونەتە بنـــچو بنەوانی ڕاستی زانستو زانیاری ، وەهەر لەخۆیانەوە گومانیان وایە کەوا بێ بڕوایی یەکێکە لەمەرجەکانی زانیـــاریو زانست ، وەئەوەی زاناو دانا ترین کەس بێ ، ئەوە بێ بڕوا ترین کەسە ، بەڵام ، لەڕاستی‌دا لەهیچ کاتو چاخێکا زانستو زانیاری نەبۆتەو نابێتە هۆی بێ‌بڕوایی‌و گومڕایی‌و یاخی بوونی خاوەنەکەی ، وەئەوزانا۔ یانەی کەبەڕاستی لەزانست تێ‌گەیشتوونو گەیشتوونەتە بنـەڕەتی بنج‌و بناوانی بەهۆی ئەزموونەکانی وەدەست هێنانی ڕاستیان ، بە ڕێبازێکی سروشتی‌ی لێکـۆڵینەوەی زانستیانە ، بەشێوەیەکی زۆر زانستیانە گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتە کەوا ئەویاسا جوانو ڕێکو پێکەی جیهانی لەسەر دامەزراوە ودروســــت بووە کەچەرخـی گەردوونو ڕۆژو مانـگو ئەستێرەکانو زەوی هەریـەکە لە ئاستی خۆیان بەدەوری چەرخەکەیان بەرێكو پێکی ئەخولێنـەوە ، وە ئەویاسا ڕێكو پێکە بەبێ‌هوودە نی‌یە ، ئەبێ پەروەردگارێكهەبێ کەلەمەوەلەوە دروستی کردبێ ، ئەویش خواوەندی تاكو تەنیـاو

بێ هاوتایە .

جا هەر لەبەر ئەوبیرو باوەڕە پڕو پووچو بێماناو بێبەڵگەنەی کەمخاوەنە ئەزانەکانیان کە پڕوپاگاندەی ناڕەوایانە بەدەمی زانایا ئەوە دەکەن ، بۆیە وا لێرەدا بیرو باوەڕی چەند زانایەکی بە ناوبانگی جیهانتان بۆئاشکرا دەکەم کەئەوکەسانەی درۆو بوختانیان بەدەمەوە ئەکەن بەدرۆیان بخەنەوە :

دکتۆر ( دینرت )ی ئەڵمانی کەیەکێکە لەوبلیمەتو ناودار و زانایانەی کەلەڕۆژئاوادا ناوبانگی دەنگی داپۆوە ، هەڵسا بەتاقی کردنەوەیەکی زۆر زانسانەی زانایانی جۆراو جۆری زانستەکان لەبارەی باوەڕیو ناباوەڕی‌یان بەخواوەند لەئەنجامی لێکۆڵینەوەو تاقی کردنەوەکەی لەگەڵ دووسەدو ئەوەد زانادا ، بۆیدەرکەوت کەتەنیا بیست کەسیان بایەخ نادەن بەباوەڕی بە بوونو نەبوونی خوا لەبەر گەوجیو مل هوڕیو بێباکیان . وەبیستو هەشت کەسیشیان نەگەیشتوونەتە هیچ باوەڕی‌یەك وەبێخوایەتی‌یان پەسند کردووە . وە دووسەدو چلو دووکەسیشیان دەرکەوت کەوا خوا ناس بوون وسەلماندی‌یان بەشی کردنەوەیەکی ژیر بێژەکیو بە ئاشکرا پێ‌یان لێناوەو بڕیاریان داوە پەروەردگارێك هەیە کە لەسەرەتاوە ئەم جیهانەی دروست کردووە . لێرەدا ئەگەر گریمان بێ بلوەڕەکان وگوێ نەدەرەکانیشمان پێکەوە ژماردمانن ، بۆمان

دەردەکەوێ کەوا لەسەدا نەوەدو دوو کەس لە گەورە زانایانی جیهان بڕوایان بەخوا هەیە .

بەڕاستی ئەم ڕێژەیەش باشترین بەڵگەو وبیینییە کەوا زۆرتری زانایانی گیتی خوا ناسن و بڕوایان بەبوونی خوا هەیە وە لە هەمان کاتدا بەدرۆخستنەوەی ئەوکەسانەشە کە بەنەزانی و ملهوڕی و نەشارەزایی و لە خۆوە پڕوپاگاندە بەدەم زانایانی جیهان بڵاودەکەنەوە ، گوایا زۆرترینی زانایانی دنیا بڕوایان بەبوونی خوا نییە ، چونکە زانایان باش دەزانن کەوا خوا ناسەتی لە هیچ چاخێکا نابێتە کۆسپ و تەگەرە لە پێش پێشکەوتنی زانستدا ، بەڵکو هانی زانایان دەدا بۆ زیاتر کۆشش کـــردن و پێشکەوتن وە دۆزینەوەی شتی تازە بۆ کامەرانی و خۆشی و شادی و ئازادی و بەختەوەری ئادەمیزاد . . .

* * *

# بیروڕای چەند زانایەکی جیهان دەربارەی باوەڕیان بەخوا

( باستۆر ) کەزانایەکی یەکجار داناو بلیمەتو لێهاتوو بووە ، کە لەسەدەی ڕابوردوو ژیاوە ئەڵێ : بیرو باوەڕی بە خوایەتی لەهیچ ساتو چاخێکدا ڕێگا لەپێشکەوتن ناگرێ ، چونکە دۆزینەوەی هەرشتێکی تازە بەهۆی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی ئەمە نیشانەو بەڵگەی هۆشەکییە لەسەر تواناو هێزو داناییو گەورەییو بوونی خوا . وە هەروەها ئەڵێ : ئەگەر لەوزانیارییەی ئێستا هەمە ، زیاترم هەبوایە ، بێگومان باوەڕم بەهێزتر دەبوو بە خواوەند .

دکتۆر ( وتز ) کەکیمیاوییەکی زۆر باڵاو لێهاتوو زانا بووە ، وەئەندامی ئەکادیمییەی زانستو عەمیدی دانیشگای پزیشکیش بووە ئەڵێ :

هەرکاتێك هەستو وڕێنەی شەوکوێری گومانو کزی بیرو باوەڕیم بەخوا بکەم ، یەکسەر چاوی دڵو هۆشم ئەکەمە ئەکادیمیەی زانستی بۆمتمانەو نەمانی دوودڵیو گومان لە دڵما ، وە بتەوبوونەوەی بیرو باوەڕیم بەیەزدان .

ئەستێرەناسی بەناوبانگ ( فای ) کەئەندامی ئەکادیمیەی

زانست بووه ئەلێ : زۆر هەڵەیە کە دەڵێن : زانست خاوەنەکەی رادەکێشێ بۆ بێخوایەتی .

ئەدمون هربرت : کەیەکێکە لەپسپۆرە هەرە بەرزەکانی دانیشگای سوربون ئەلێ

هەرگیز زانست نابێتە هۆی راکێشانو سەرگەردانی خاوەنەکەی کەبەرەو پێری بێ باوەڕیو بێخوایەتی بیبات ، وە یاخود بەرەو ماددیەت وگومانو دوودڵی بیبات لەبارەی بوونی خوا .

مامۆستای ماتماتیکی هۆشمەندو بەناوبانگ ( کوشی ) ئەلێ:
ئەم بیرو باوەڕەی کەبەخوام هەیە ، بەرهەمی ئەنجامی ریبازی سروشتی لێکۆڵینەوەی زانستی زۆر قووڵی خۆمە ، تاك بەهۆی ئەوەوەبێ کە وەك میراتێك لەباوکو باپیرانمەوە بۆم بەجێ مابێ .

فیزیك زانی بەناوبانگ ( فابر ) ئەلێ : لەهەرچاخێکا ئارەزوو هەوەسو ورێنەی شێتایەتی تێدایە ، کەمرۆڤ پێ‌ی گومراو سەرگەردانو سەرلێ شێواوبێ ، بەڵام ، لەم چاخەدا زیاتر ئەو شێتاییەتییە باوو ئاشکرایە ، ئەویش بەهۆی نابلاوەڕی زۆر لەنەزانو گومرابووان بەخواوەند ، وەزیاتر ئەلێ : زۆرم پێ خۆشە ئەگەر پێستم لەبەردا بدرن ، ئەوەك بیرو باوەڕیم بەخوا لە مێشکما دەربهێنن .

زانای سروشتی بەناوبانگ ( اللورد کیلفن ) ئەلێ :

ئەگەر زۆر بیربکەیتەوە وورد ببیەوە ، زانست ناچارت دەکات ، کەوا باوەڕی بەبوونی خوا بکەیت .

زاناو پسپۆڕی ئینگلیزی ( **فرانسس بیکون** ) ئەڵێ: ئەوکەسەی کەم شارەزایی بێت لەفەلسەفە ، ئەمە ئەبێتە هۆی ڕاکێشانی بەرەو پەیڕەوی ئەو کێشەی و بێباوەڕی ، بەڵام زۆر شارەزابی و چوونە بنەچ و بنەوانی فەلسەفە ، دەیگێڕێتەوە بۆ ئایین و خوا پەرستی .

وە هەروەها قورئانی پیرۆزیش هەزارو سێسەدو نەوەد و هەشت[1] ساڵ لەمەوپێش ئەم ڕاستی یەی ئاشکرا کردووە ، کەوا زانایان پێش هەموو کەسێك لەخوا دەترسێن و بڕوا بەگەورەیی دەکەن .

خوای گەورە لە سوورەی ( فاطر ) لە ئایەتی ( ٢٨ ) دا فەرمویەتی : ( إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَاءُ ) واتە : بەڕاستی هەر زانایانن لە خوادەترسێن و مل کەچی فەرمایشتەکانی دەکەن بەهۆی ووردبوونەوەو لێکۆڵینەوەیان لە نهێنی و جوانکاری و چۆنیەتی دروست بوونی ئەم بوونەوەرە و لە وورده‌کاری و ڕەوانبێژی قورئانی پیرۆز ، وە هەر ئەوانن گەیشتوونەتە ئەو قەناعەت و باوەڕی یە کەوا دەبێ داهێنەرێك هەبێ کەئەم جیهانەی دروست کردبێ ، چونکە بۆیان ڕوون بووەتەوە کە هیچ ئامێرێك

١- ئێستا لەوا بلاو سالی ٢٠٠٦ ١٤٠٠ دەچێت

( آلة ) لەخۆیەوە دروست نابێ وەیاخود هیچ تەنێك لە خۆیەوە ناجوڵێتەوە تامێزی بزوێنەرێکی تر کاری لێنەکات . .

چاچۆن هەشێ ئەو زەوی و ئاسمان و ڕۆژو مانگو ئەستێرەکان هەر لەخۆیانەوە بەرێکەوت دروست بووبن وهەریەکە لە ئاستی چەرخی کەمەرەی خۆیدا بجوولێتەوە لەسەر یاسایەکی ڕێك و پێك ، کە ئەقلی زۆرزان ترین مرۆڤ لە نهێنی جوانکاری یاساکانیان حەیران و سەرگەردانە ، بەبێ داهێنەرێك . . ! !

وەهەروەها لەســـوورەی ( آل عمران ) لە ئایەتی (١٨ ) دا خواوەندی گەورە ئەفەرمووی :

( شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ )

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خواوەندی مەزن ، زانایان و فریشتەکانی لەیەك پلەو پێزەرازو داناوە لە بارەی شایەدیان لەسەر تاك و تەنیایی و بوونی خواوەند . وەلێرەدا لەپـــاش ئەمهەموو نموونە هێنیـانەوە لە سەر بیروباوەری گەورە زانـایان پێـویستە پەیرەوی بیوڕای چاك و دروستیان بکەین ، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی کە گیرۆدەی داوی بەدبەختی و و شکە بیر و باوەری پووچ و بێباوەری و گومانو دوودڵیو سەرکێشی و گومڕایی ئەم چاخە بووینە ، بەهۆی لـــە خۆ بایی بـوون و هەوەس و ئارەزوو ، کەمێك بیر لەحالی پەریشان و شەمزاوو سەرگەردانی

خۆیان بکەنەوە ، وەلە بیابانی مل هوڕی و سەرپێچی و یاخی بوون بگەڕێنەوە ، بۆ باخ و باخات و گوڵەوزاری پڕو باوەڕی و خواناسین و گوێڕایەڵی فەرمایشتەکانی پەروەردگاری جیهان .

## سوپاس

پڕ بەدڵ زۆر سوپاسی بێ پایانی مامۆستایانی بەڕێزو ئازیزم مامۆستای زۆر بلیمەت و زاناو دانای خۆشەویستم مامۆستا مەلا ( عبدالله چرستانی ) و مامۆستا مەلا محمد حامد ومامۆستا خالد مەلا محمد ومامۆستای شاعیرو نووسەر ( محمد امین کاردۆخی ) و مامۆستا ( حسن حمە کریم حسن ) دەکەم کە پێش چاپکردنی ئەم پەرتووکەم ئەرکی پیاچوونەوەیان خستە سەر ئەستۆی خۆیان وەلەهەمان کاتدا هانیان دام کەزوو چاپی بکەم ، چونکە لەلایان زۆر پەسەندو بەنرخ و گرنگ بوو ، دووبارە سوپاسیان دەکەمەوە لەسەر بیرو باوەڕیە دڵسۆزیان .

دانـەر

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ( ١٣٤٢ )
١/ ١٠/ ١٩٨١
(٦٠٠٠) نسخة

نرخی ٢٥٠ فلسە

بەڕەزامەندی وەزارەتی ڕاگەیاندن لە چاپ دراوە

چاپخانەی سەرهەد
شەقای موتەنەبی - بەغداد